گەشـــایەوە ئـــەمجار دەم و چـــاوی ســـۆارە و قاســـمی مـــاچ کـــرد و چاوەکـــانی پڕبـــون لـــە فرمێـــسکی شـــادی، ڕوی تێکـــردن و وتـــی :« بـــرا خۆشەویـــستەکانم، ئێـــستا چـــی بکـــەین تـــا کـــو بـــە ئـــاوات بگـــەین؟» ســـۆارە وتـــی :« بـــە بـــڕوای مـــن خوینـــدن ... بـــەڵی خوینـــدن مرهـــەمی زامـــی ئیمـــە خویندنـــە .. ئـــەگر تـــۆزە ســـەوادیکمان هـــەبێ ئـــەتوانین خەڵکـــە کـــە ڕون بکەینـــەوە و مەبەســـتەکەیان بـــەڕیک و پێکـــی و جـــوانی بـــۆ بـــاس بکـــەین و لـــە دەوری یـــەکتر کۆیـــان کەینـــەوە لـــەڕوی حیـــساب و کیتابـــەوە، یەکایـــەتیان لـــە نـــاو دا پێـــک بـــەهێنین وەهـــا یـــەک گرتویـــان بکـــەین هـــەمویان وەک پۆلایـــەکی قـــورس و گـــران لـــی بێـــت. هـــەر وەک ئـــەم دارە مـــازوە بـــەرزە و ئەســـتورەکە دەمێـــک ســـاڵە لـــە برامبـــەری بـــەفرو بـــاران و ســـەرماو خۆشـــی و ناخۆشـــی وەک کێـــوکی بـــەرز خـــۆی ڕاگرتـــووە و ڕاوەســـتاوە، بـــە هـــیچ کۆســـب و چەڵمەیـــەک لار نەبۆتـــەوە ئـــەبێت ئیمـــەش و تـــەواوی خـــەڵکی گونـــدەکان لـــەم دارە پـــڕ بایخـــە کـــەڵک و سەرمەشـــق ورگـــرین.» قاســـم هاتـــە جـــوواب و وتـــی :« ڕاســـت ئەکـــەی ســـۆارە بـــەڵام بـــۆ خوینـــدن و فیربـــون ئایـــا بـــۆ ئیمـــە درنـــگ نییـــە؟ » حەمـــە لاو وڵـــامی داوە :« نـــا ... نـــابرام بـــۆ فیربـــونی زانـــستی هـــیچ کـــات وە لـــە هـــیچ تەمـــەنیک دا دەرنـــگ نییـــە، براکـــان باشـــتێک و پـــێ بڵـــیم ، نـــە ئـــەم زۆردارانـــە وا زولـــە نـــاو ئـــەچن وە نـــە ئیمـــەش ئـــەتوانین ئـــەم ســـەر شـــۆریە هیچـــی کـــە قـــەبوڵ بکـــەین.» بـــەم

جـۆرە ئـەم سـێ لاوە جـوامێر و خـوێن گـەرم و لـە خـۆ بوردووانـە دەسـتی یەکـەتی و پیاوەتیـان بـۆ گەیـشتن بـە ئامـانج و ئـازاری دایـە دەسـتی یـەک و سـوێندیان بـۆ یـەکتر خـوارد کـە هـەرگیز لـە یـەک جیـا نەبنـەوە. ئـەو ڕۆژە تـا کـو نیزیکـە ئێـواری لـە دەوری یـەکتر کۆبونـەوە و لـە ژێـر دارە مازۆکـە دانیـشتن و لـەو بابەتـەو ئـەم مەبەسـتە لەگـەڵ یـەک وتووێژیـان کـرد. حەمـە لاو لـە ئـاخری وتووێژەکـە دا سـەری هـەڵبڕی و وتـی :« دارە پیـرە تـۆ شـایەت بـە، ئیمـە هـەر سـێ مـان بـە یـاری خـووا بـەڵین مـان پێـک دا تـا کـو ئـەو ڕۆژە زوڵـم و زۆری ئـەم تاقمـە زۆردار و خـوێن خۆرانـە لـە سـەر خۆمـان و تـەواوی دانیـشتوانی ئـەم ناوچەیـە لانـە دەیـن و دەسـتیان کـورت نەکینـەوە پیمـان ئەبەسـتین حەسـانەوە لـە خۆمـان حـەرام ئەکـەین». قاسـم وتـی :« حەمـە لاو سـوارە خوڵـە ناوچـەی ئیمـە دا فیرگەخانـە ( مدرسـە) نییـە هـەتا ئیمـە بـەچین و دەرس بـەخوینین».

سـوارە وتـی :« ئـەچین بـۆ شـار بەهەرسـیکمان هۆدەیـەک بـۆ خـەو خـواردن دەگـرین و لـە قوتابخانـەکانی نـاو شـار دەرس ئـەخوینین» قاسـم وتـی :« بـە خـووا ئیمـە تەمـەنمان زۆرە بـاوەڕ ناکـەم لـە قوتابخانـەکان ڕێگـا بـە ئیمـە بـدەن مەگـەر بـەچین بـۆ مزگەوتـەکان لـە لای ماموسـتاکان دەرس بـەخوینین». حەمـە لاو وتـی:« بژیـت قاسـم ئەمـە زۆر بیریکـی بـاش و بـەجی یە، لـە دولاوە بـۆ ئیمـە باشـە، یـەکم

دەرس ئـــەخوینین و دوهـــەم شـــەوانەش هـــەر لـــەوی ئەخـــەوین. خواردەمـــەنی و کـــەلو پـــەلیش مـــان لـــە ماڵـــەوە بـــۆ ئـــەهێنن». ســـوارە بـــە پێکەنینـــەوە وتـــی :« حەمـــە لاو هـــەر خـــووا ئـــەزانی ئـــەبێ ئیمـــە چەنـــد ســـاڵ بـــەخوینین هـــەتا شـــتێک فیـــر بـــین و بـــەتوانین خـــەڵکی رۆن بکەینـــەوە». حەمـــە لاو وتـــی :« ســـوارە لـــە ســـایەی خـــوواوە ئیمـــە گـــەورین و پیـــاوین و عـــەقڵ و هۆشـــی تـــەواومان هەیـــە، لام وایـــە ئـــەگر دو ســـاڵ بـــێ کەنـــد و کۆســـپ دەرس بـــەخوینین وە لـــە تـــەک پیـــاو گـــەورە و زاناکـــان هاموشـــۆمان بـــە بیـــت، بتـــەواوی هەموشـــتیک فیرئـــەبین و ئـــەتوانین بـــەدەمی گـــەرم بـــۆ بردەنـــی نـــاوەی ئـــەم گیـــر و گرفتـــە لەگـــەڵ خەڵکـــە کـــە بـــە باشـــی وتـــوویژ بکـــەین و وەرونیـــان بکەینـــەوە ...» قاســـم وتـــی :« ئـــەزانن پرادەیـــەک ســـەرگەرمی ئـــەم قەســـانە بـــوین نـــان خواردنمـــان لـــە بیـــر چۆتـــەوە.» حەمـــە لاو وتـــی :« بـــە خـــووا لـــە خۆشـــی ئیـــوە ئەمـــە خـــۆر ئـــاوا بونـــە ئیـــستاش برســـیم نییـــە و نـــان خـــواردنم لـــە بیـــر چۆتـــەوە» ئـــەو رۆژە کاتیـــک کـــە خـــۆر زردەیـــەکی مـــابووە بـــە ئەســـپایی لـــە ســـەر کیوەکـــان خـــۆی را ئەکیـــشا تـــا کـــو خـــۆی حەشـــار بـــدات و ئـــاوا بیـــت، ئـــەم ســـی لاوە بریـــاران دانـــا کـــە بیـــانی پـــیش خـــۆز کـــەوتن خۆیـــان ئامـــادە بکـــەن و بەروشـــار بکەونـــە رێ ... لـــە ژێـــر دار مازوکـــە جیابونـــەوە و بـــەرو گونـــدی کیـــوە ســـور ســـەر و ژیربونـــووەوە کەوتنـــە رێ، کـــاتی گەیـــشتنە وەنـــا و ئـــاوایی بتـــەواوی ولـــات تاریـــک

ببـو، زۆر لـە ماڵـەکان چـرا نـۆ تێکانیـان دا گیرسـاند بـو، هـەر کـام لـە مـاڵی خۆیـان نانیـان خـوارد و حەسـانە وە و خـەوتن ... شـەوی تاریـک و ڕەش لـە تیپـەڕین دا بـو، بایـەکی فینکـی بـەیانی دەسـتی کـرد بـە شـنە شـن و کـە لەشـێرەکان دەسـتیان کـرد بـە قولـە قـول مـژدەی تێپـەڕینی و وهاتـەنی ڕۆژیکـی تازەیـان بـەو کەسـانەی تـاکو ئێسـتا خـەوتبونو و لـە تەنگـە و چەلەمـەی ڕۆژی پێـشو حەسـابونەوە، خەبـەریان دەکردنـەوە هێـواش هێـواش ئەسـتێرەکان ڕۆنـاکی خۆیـان لـە دەسـت ئـەدا و هـەورە تاریکەکـەی شـەو جێگـای خـۆی بـە هـەوری سـپی لـە گۆڕەپـانی ئاسـمان دا ئـاڵوگۆر ئـەکرد، لـە سـی مـاڵ لـە ئـاوای کێوەسـور سـی لاو کـە هـەرکامیان کـوڵیکی بەپـشتەوە بـو دەر کـەوتن پەشـتیان لـە ئـاوایی و رویـان لـە چـوڵی بـە دڵ گرمیکـی قـورس و بیـر و بـاوەڕیکی نـوی هومێـد بـە خـوا، کەوتنـە ڕی، کـاتی گەیـشتنە لای ئەسـتێرەکەی ئاوایـە کـە کۆڵەکـەیان دانـا و دەسـت نویژیـان گرتـو بـەرو قوبلـە ڕاوەسـتان و دو ڕەکائـەت نـویژی بـەیانی کـە لەسـەر شـانیان بـو بـەجی هینـا و لـە پاشـان دەسـتیان بـەرز کـردەوە و لـە خـوا پاڕانـەوە تـەنیا هـەر خـوا ئـەیزانی لـە نـاو دڵـی هـەر کامیـان چـە ئـاوات و ئارەزویـەکی تێـدا یـە، چـەیان بـە دڵ دا ئـەهات و چـە یـان لـە خـورا داوا ئـەکرد لـە پـاش تـەواو بـون لـە نـویژ ... بـە سـەر پێـوە نانیکیـان بـە پەلـە خـوارد و حەمـە لاو وتـی :« هەلـستن پیاوانـە بـڕوین

تـاکو خـۆر ئەکـەویت خۆمـان لـە پێـدا هـەڵ چـونی ئـەم کێـوە ڕزگـار بکـەین خۆمـان بگەیەنینـە سـەر لوتکـەی کێـوە کـە ئـەمجار سـەر و لیـژی بـڕوین بـەرەو پێـشەوە،کۆڵەکانیان بـە کـۆڵ دادا و یـەک پەشـو ڕۆیـشتن نـاو شـار، خـۆری نیـوەڕۆ ئاسـمانی داگرتبـو، لایـان دا بـۆ ناوچایخانەیـەک دو سـێ چایـان خـواردەوە و حەسـانەوە، زۆری پـێ نـە چـو کـە بـانگی مزگەوتـەکانی نـاو شـار دەسـتی پێکـرد کۆڵـەکانیان خـستە ژێـر باخـەڵیان و بـەر مزگـەوتی گـەورە کەوتنـەڕێ دەسـت نـویژیکی باشـیان گـرت و خۆیـان تـەواو خـاوین کـردەوە و پێلاوەکانیـان و کۆڵـەکانیان لـە قـولینچێکی نـاو حەوشـەی مزگەوتـەدا جـێ هێـشت و ڕویـان کـردە نـاو مـاڵی خـوا، تـازە نـویژی جماعـەتی نیـوەڕو دەسـتی پێکـرد بـو کـە ئـەم سـێ لاوەش لـە نویژەکـە دا بەشـداربون لـە پـاش تـەواو بـونی نـویژ و ڕۆیـشتەنی خەڵکەکـە چونـە بـەرەوە و لـە تـەک ماموسـتای مزگەوتەکـە لـە بابـەت مەبەسـتەکەیان زۆریـان وتـوویژ کـرد، ماموسـتا کـە پیـاویکی زانـا و تێگەیـشتو و عـالم بـو زۆر زۆری پێخـوش بـو وە ڕیـزی لیگـرتن بـە خیرهـاتنی کـردن ... مـاوەی دو. سـاڵ تـەواو ئـەم سـێ مروڤـە شـەو و ڕۆژ بـە دڵگرمیکـی تـەواو خریکـی خوینـدن و فیربـونی زانـست و زانیـاری بـون، بـە قولیـک هـەر شـەویک ڕێگـای دە شـەویان دەپیـوا و لـەو ماوەیـە دا لـە بـر ئامـانجی خۆیـان وەهـا زانـست و زانیـاری فیربـون

و وەهـــا چاویـــان کرایـــەوە کـــە لـــە زۆر جێگـــای فێرگـــەکان و مەدرەســـەکان باســـی زانـــای و زانیـــاری ئـــەم ســـی لاوانـــەیان دەکـــرد، ماموســـتاش لـــە بـــەر ئەمـــە زەحمەتەکـــەی کـــە لەگـــەڵیانی کیـــشا بـــو بەزایـــە نـــەچو بـــو، شـــانازیکی زۆری پیـــدەکردن لـــە پـــاش دو ســـاڵ هـــەوڵ دان و تێکۆشـــان و بیـــر و بـــاوەڕیکی جـــوان و پـــاک و خـــاوین، بـــە دەســـتی پـــڕ و میـــشکی پـــڕ لـــە زانـــست و زانیـــاری لـــە پـــاش خـــوا حـــافیزی و دەســـت مـــاچ کردنـــی ماموســـتا بـــەرو مـــاڵ و ئاوایەکـــەیان گڕانەوە ...

دانیـــشتوکانی ئـــاوایی کیوەســـور و گونـــدەکانی دەور و بـــەر کـــاتی ئاگـــاداری گڕانـــەوەی ئـــەم ســـی پیـــاوە بـــەرز و بـــە هەڵمەتـــە بـــون پیـــشوازیکی گـــەرمیان لیکـــردن و باوەشـــیان بـــۆ دەکردنـــەوە و ســـەر و چاویـــان مـــاچ دەکـــردن، مـــاوەی حەوتویـــەکی تـــەواو میـــوان و میوانـــداریان بـــوگرتن، هـــەر شـــەولە ماڵیـــک و هـــەر ڕۆژ لـــە ماڵیـــک میـــوان دەبـــون، خـــەڵکی ئـــاوایی کیوەســـور و گونـــدەکانی دەوربـــەر بـــە گیـــان و دڵـــەوە ڕیزیـــان لـــە ئـــەگرتن، مـــاوەی دە ڕۆژ لـــە هاتنـــەوەیان تـــێ پـــەر ببـــو کـــە ڕۆژیـــک بـــەیانی حەمـــەلاو تـــەواوی خـــەڵکی ئاوایەکـــەی بـــە ژن و پیـــاو و پیـــر و لاو و میـــر منـــداڵ کـــۆ کـــردەوە و خـــۆی لـــە جیگایـــەکی بـــەرز ڕاوەســـتا و ســـوارە لـــە لای شـــانی ڕاســـتی و قاســـم لـــە لای شـــانی چـــەپی ڕاوەســـتان، حەمـــەلاو کـــاتی دڵنیـــا بـــو کـــە تـــەواوی

خەڵکەکە کۆبونەوە گوی یان بۆ ڕاگرتووە، بەم جۆرە دەستی بەو تارکەی کرد وتی :« بە ناوی خووای گەورە و میهربان، دانیشتۆکان بە شەڕەفی گوندی کێوەسور و دەوروبەر لە پاش سڵاویکی گەرم و بەتین هەر وەک خۆتان ئەزانن ئیمە ئەم سی کەسە ماوەی دو ساڵ بۆ فیربونی زانست و زانیاری، ئەم گوندە و ئێوەمان جێ هیشت بۆ ئەمە فیری زانست و زانیاری بەبین و چاومان بکرێتەوە و لە دونیایی ئیمڕو کە تێدا دەژین حاڵی بین،تاکوبزانین چی بووەو چی قوماوەبۆچ ئیمەلەهیچ حاڵی نین و هیچ نازانین . جا هەر لە بەر ئەمە بۆ کە ئیمە ئەو سی کەسە ماوەی دو ساڵی تەواو بۆ فیربونی زانست و زانیاری ئەم گوندە و ئیوەمان بەجی هێشت تاکو چاومان بکرێتەوە و لە دونیای ئەمڕو حاڵی بین خۆمان و ئێوە و ناموس و شەڕفەمان لە ژێر پیلاوی تاقمەیێەک خوین خۆر و لە خووا بێ خەبر ڕزگار بکەین وەک ووتی دیلی و نەزانین ونەخویندەواری لە ملی خۆمان و مناڵەکان مان دادەماڵین . ئیستاش وا چاکە یەک بگرین ویەک گرتوبین . ئەگرهەمومان یەک گرتووبین وەک پۆلایەکمان لی دی کەهیچ شتیک کاری لی ناکات وناتوانی لەبەینی بەریت ئیستاش ئەبی زیاترڕیگای خوواوخوواناسین بەپیوین تاکوبەئامانج بگەین . میژوواپیشان ئەدات کەئەوکەسانەیەک گرتوبون پیکەو تونو

.وەهیچ کەسێک و هیچ تاقمیک نەیتۆانیوه تیکیان ڕمێنی و زوڵم وزۆریان لی بکات و پەشتیان بەشکێنی، ئەگر ئیمە گەشتمان بەیکەوە یەک گرتوبین وە پیاوانە یەک بگرین و دەستی یەکەتی و برایەتی بەدینە دەستی یەک هەولْ شەڕەف و حەیا و ناموسمان ئەپاریزن و دوهەم دەست کەوتوی دەستەکانمان کە بەرهەمی سالیک ڕەنج و بەدبەختی و زەحمەت خۆمان و ژن و منالەکانمان بە هەزار دەرد و چەلمە و ناکۆکی و دەستی دەهێنین کەس ناتوانی بە زۆری و مل هورری و خوڕایی لە دەستمان بەستێنی و لە دەستی نادەین ئیمە یەک گرتوبین، ملی مل هوڕان لە گیانی پیس و چەپەلیان جیا ئەکینەوه، ئیمە ئەبێ بە تیکڕایی وەک پیاو ڕاوەستین و دەستی ئەم تاقمە ناپیاوانە کورت بکەینە، هەتاکەی سەرداخێن و خۆمان حەشار بدەین ئەوانیش زوڵم و زۆر لە ئیمە بکەن، ئەیوه ئەڕوانن و بە چاوی خۆتان چاوتان پیکەوتووە کلە شیریک، دور نەڕوین کلەشیرەکەی مالی مام حوسین کە چوار مریشکی شەو و ڕۆژ لەگەل دایە، کە ئەم چوار مریشکە بە ناموسی خۆی ئەزانی، ئەگر کلە شیریکی کە هەلکوتیتە سەر یەکی لەم مریشکانە کلْ شیرەکە چۆن ئامبازی ئەبێت و هەتا تەنۆکی ئاخری خوینی لە لەشی دایە شڕی لەگەلْ ئەکات و ڕاوی دەدات و پاریزگاری لە مریشکەکە ئەکات. من پرسیارم لە ئێوە

ئەمەیە ئایا ئیمەکە ئادمیزادین لە سایەی خووا عەقلْ و هۆشمان هەیە، توانای کلّەشیریکشمان نییە؟ ئایا خووای گەورە و میهربان ئیمە بۆ ژیان و ژیان کردن و ئازادی بەدی نەهێناوە ئایا ژیان مردن لە دەست خووا دا نییە؟ براکان ئیمە لەم گوندە دا ئەژین و ژیان ئەکەین، ئەگر وایە ئەبێ لە ناموس و سنوری خۆمان پاریزگاری بکەین و بەسەر بەرزی بژین، لام وایە زۆر لە ئێوە چاوتان بە شارکەوتووە لە وڵاتی ئیمە دا هەزاران گوندو شار هەیە و وەسەر پەرستی تەواوی شار و لادیەکان لە ژیر ئاڵای حوکمەت دایە، تەواوی ئیمە و خەڵکی شارەکان لە ژیر ئاڵای حوکمەت دا ئەژین ئیمە لە شار نامەیەکمان نوسیوە، داومانە بە دەستی ڕاسپێراوەکانی حوکمەت و هەمیسان ئەنوسین و شەکایت ئەکەین ئەگر وڵامیان پێ نداینەوە ئەمجار خۆمان بەیەکەوە یەک گرتویی و پشت ئەدەینە پەشتی یەکتر و بە یارمەتی خووا ئازا و پێاوەتی خۆمان ئەم تاقمە ناپیاوانە لە سەر خۆمان لا ئەبێن ... تەواوی خەڵکەکە ڕەق ڕاوەستا بون و مرتەقیان لی براِبو سەریان سوڕ مابو کە حەمەلاو و کوڕی سوفی شەریف، ئەم هەمو زانایی و ڕۆشن بیری و وتە جوانانە لە کویی فیربووە و کی فیری کردووە؟ خەڵکەکە وتەکانی حەمەلاویان زۆر پێخۆش بو وە بە تەواوی گوی یان بۆ شل کردبو، حەمە لاو وتی بەریزەکان خۆشەویستەکان

ئـەبێت ئیمـە لـە پـیش تـەواوی ئـیش و کارەکـان دا، مزگـەوت دروسـت بکـەین مزگـەوت مانـای جێگـای کۆبونـەوە بـۆ سـوپاس و ڕیزگـرتن لـە خـووا، ئـەم خووایـەی کـە ئیمـەی خـەڵق کـردووەوە و بـەدی هێنـاوین، ئـەم خووایـە کـە گیـان و ڕوحـی بـە ئیمـە داوە، ئـەم خووایـە کـە دایمـە لـە چـەوتی و ڕاسـتی و ژیـن و ژیـانی ئیمـە ئاگـادارە، ئـەم خووایـە کـە نیـر و میـوی خوڵقانـدوە تـا کـو لـە نیزیـک بـونی ئـەوان بـۆ بـەردەوامی ڕەسـن و ڕەگـەز ئـەولاد بـەدی بـەهینین، دوامـی ژیـان پایـەدار بـێ جـا فـەرق ناکـات ئـەم نیـر و میـوە چـە ئـادەمیزاد بـێ یـان حـەیوان ، هـەر کـام ڕیگایـەکی هەیـە فـەرق ناکـات بـۆ نیزامـی مانـەوەی ژیـن لەسـەر دونیـا ئـەبێت ئـەم بونـە پایـەدار بێـت ... مـن ئیمـڕو بـە دەنگـی بـەرز هـاوار ئەکـەم وە بـە ئێـوە ڕادەگـەینم خـەڵکی خۆشەویـستی ئـاوایی کێوەسـور، یـان ئـەبێت هـەموومان یـەک گـرین ئـازا و نـەبز بـین یـان تـاکو مـزدن بەسـەر شـوڕی و مـل شـوڕی زوڵـم و زۆری ئـەم تاقمـە و ژیـانی وەک مـردن قـەبوڵ بکـەین، بـە بـڕوای مـن باشـتر ئەویـە دەسـت بخینـە نـاو دەسـتی یـەک و پیمـان ببەسـتێن و پیاوانـە بـژین و چـی کـە حـەقی مـل هـۆری و بـاج بـەم تاقمـە نامـەردە و لـە خـووا بەدورانـە نـەدەین، ئیمـە ئـەبێ سـەنگەر دروسـت بکـەین هـەوڵین سـەنگەری ئیمـە مزگەوتـە، لـە نـاو مزگـەوت دا کـۆ ئەبینـەوە، مەبەسـت و پیویـستەکانمان بـاس ئەکـەین و نـویژ ئەکـەین و لـە خـووا ئەپاڕینـەوە

هە تا سەرکوتو بین، ئەمریٚ فەرمانی خوواَ لە ناو مزگەوتەکە بەجی ئەهینین و قورئان ئەخوینین بەرامبەری ئەمری خوواَ رەفتار ئەکەین، ئەمەش باش یزانن هەر کەسی هومیٚدی بە خوواَ بیٚت و پەشتی بە خوواَ ببەستی خوواَ ئاگاداری لی دەکات و پشتی ناشکیٚنی ... لەم کاتەدا مام رەحمان ـ کە پیاویکی ریش سپی قەلو و تیٚک سەرماەبو، خاوەنی موچە و مەزرایەکی زۆر بو، خەلکی گوندەکەش زۆریان خۆش ئەویست و ریزیان لی دەگرت ـ لە ناو خەلکەدا هاواری کرد، حەمەلاو حەمەلاویٚ شیری دایکت لی حەلال بیٚت، بە خوواَ وتارەکەت و قسەکانت لە ناو دلی من دا وەها کاریگەر بو لە خۆشیان فرمیسکی گەرم بە چاوەکانم دا هاتە خوار ئیستاش بەشایەتی ئەم خەلقە بە خۆم و کورەکان و مال و دارایەکەم هەتا پشوی ئاخر لەگەل ئیٚوەم هەر چۆنی ئیٚوە باش ئەزانن منیش ئەمە ئەکەم کاتی خەلکەکە ئەمەیان لە دەمی مام رەحمان بیست، تەواو خەلکە کە بە تیٚکرایی هاواریان کرد حەمەلاو حەمەلاو ئیمەش هەمومان لە تەک ئیٚوەین و تاوەکو تەنۆکی خوین لە ناو لەشمان دا مابیٚت پەشتو ئەگرین و فەرمان بەجی ئەهیٚنین، کاک پیرۆت هاواری کرد و وتی ئەگر قەبولی کەن من ئەم زەوییەی لە بەر مالانەوە لە ناو جەرگی ئاوایە کە دایە پیٚشکەشی ئەکەم بۆ دروست کردنی مزگەوت مالی خوواَ وە

ئەمەی لەدەستم بیت دریغی نا کەم . کاک مەحمود کەدارتاشی ئاوایەکەبو هاواری کردو وتی منیش دەروست کردەنی تەواوی دەرگاو پەنجەرەکانی وەئەستوی خۆم دەگرم . لەم کۆبونەوەیەخڵکەکەهەرکامیاب بەگویرەخۆیان بەڵینی شتیکیان دا . ئەمجارکاک وسمان کەئاسنگەری ئاوایەکەبوهاواری کرد حمەلاو. سوارەقاسەم وەرن با گەشتمان بکەوینەڕی و بڕۆین بۆدیاری کردەنی زەویکەو بەهومێدی خووا دەست بەکاربین . بەتێکڕایی کەوتنەڕی و ڕۆیشتن تاگەیشتنەسەرزەویکەلەپاش وتوویژیکی زۆرجێگاکەیان دیاری کرد و گڵاڵەیان کێشاو ...

ماوەیەکی زۆری نەکێشا . لەبەر ئەوە خەڵکە کە بەگیان ودڵ ڕۆژ و شەوکاریان دەکرد مزگەوتێکی جووان وگەورە و ڕێک و پێک تەواویان پێک هێناناماده‌یان کرد . نیزیک نویژی نیوەڕو بو . هەولین کەس قاسەم بو کەلەبرهیوانی مزگەوتەتازەکەبەدەنگیکی بەرزدەستی بەبانگ و ناوی اللەو ئەکبەری لەناو مزگەوتی تازەپێک هاتوی کێوەسور بڵاو کردەوەو بەگویی خڵکی ڕاگەیاند خڵکەکەگویان لەبانگی نیوەڕو بو تەواویان کۆ بو نەوەو دەست نویژیان شوشتو ئامادەبون حمەلاویش پێش نویژی بۆ کردن فەرمانی خوایان بەتیکڕایی بەئەنجام گەیاند . لەپاش تەواو بونی نویژەکەهەمویان دەستیان

بەرزکردەوەوسوپاسـیان لـەخوای مـەزن وبێـی هاوتـا کـرد. حمـەلاو بەخڵکەکـەی ڕاگەیاند لـەپاش نـویژی ئیـواری کۆبونـەوەمان هەیـە. تکائەکـەم هـەموتان کۆبنەوەئـەمجار بلاوەیـان کـرد بۆخـواردنی نـان و چـایی نیـوەڕو ڕۆیـشنەوەبو مـاڵی خۆیـان . خریکـی ئـیش و کاریـان بـون ... لـەکاتی خۆیداقاسـەم بـانگی ئیـواریی دەسـت پێکـرد تـەواوی خڵکەکـەبۆ نویژهـاتن بـۆ مزگـەوت و کۆبـو نـەوە. لـەپاش تـەواو بـونی نـویژ سوارەهەستایەسـەرپێ باسـی ژیـان و گـەورەیی خـوواو خۆشەویـستی پێغمبـەری ( ص ) بـۆکردن خڵکەکەئـەم باسەشـیان زۆر پیخـۆش بـو . لـەپاش تـەواو بـونی وتـەکانی سـوارەخواحافیزیان کـردو ڕویـشتن . گەشـت ڕۆژو زۆر لەشـەوان خڵکـی ئـاوای کیوەسـورو ناوچەکەلـەناو مزگـەوتی تـازەدا کۆدەبونـەوەو بەنۆرەحمـەلاو و سـوارەو قاسـەم باسـی دیـن و قـورءان و سەربەسـتی و خوینـدن و خویندەواریان بـۆ دەکـردن . زۆرلەخڵکـەکان پێـشنیاری ناونوسـی منالـەکانیان بـۆ فیربـونی زانـست و زانیـاری و دەرس خوینـدن بـەم سـەپیاوەئازاو چالاکـەدەکرد . کەمنالـەکانیان بەنێرنەمزگـەوت و دەرس بخـونین . ئـەوانیش هەرسـیکیان بـەدڵ گرمیکـی زۆر لەوپێشنیارەپێـشوازیان کـرد لەگونـدی کێوەسـوروئاوایەکانی دەوروبـر لەچەنـد روژدانیزیکەپانزدەبیـست منـاڵ و میرمنـاڵ و لاوی تازەپێگەیـشتویان ناویـان نوسـی و ئامـادەی

دەرس خوێنــدن بــون . خێــر وخۆشــی و بــەختیاری روی کردبــو نــاو ئــاوایی کێوەســـور خـــەڵکی بەدڵخۆشـــی و دڵگرمـــی خریکـــی ئیــشووکاری ڕۆژانــەبون . بــەڵام ئــەم حەســانەوەو خێــرو خۆشــیەزۆری نەخایانــد . ڕۆژێـــک لــەپڕدا تاقمەچتەومـــەل هۆڕەکــان بــەهات و هــاوارو تــەق و تــوق پەیــدا بونــەوەو ئاڵۆزیــان خەســتەوەناو ئاوایەکــە. ئەمجارخەڵکەکەلەبەرئـــەوەدڵگرم بونـــو بـــاش ڕون ببونەوەترســـیان لــەدڵ دا نــەبووە ترســیان بەوتــەکانی حەمــەلاو شــەکابو . ئاوایەکــەیان چــوڵ نــەکردو خۆیــان لــەبن بردوکێوحەشــارنەدا. وەک پیــاوان برامبــــەری تاقمەکەڕاوەســـتان تاقمەکەوبەڕیوەبەرەکـــەیان زۆریـــان پــێ ســەیربو . حمــەلاو ســـوارەو قاســـەم لەپێـــشەوەی هـــەمو خڵکەکەڕاوەســـتابون . مـــەل هۆڕەکـــان دەوری خڵکەکـــەیان داوگــەمارویان دابــون و بــەدەنگی بــەرز پــێ ئەکــەنین و گاڵتــەیان پــێ ئــەکردن . حمــەلاو روی کردەســەڕوکی زۆردارەکــان ووتــی چــی تــان لــەگیانی ئیمەئــەویت ؟ بــوچ دەســتمان لــی هــەڵ نــاگرن . ئیمەبەهـــەژاریو کلـــۆلیێ هـــەزار دردو بەدبـــەختی نــاتوانین نــانی ڕۆژانــەی خۆمــان وەدەســت بێنــین . ئیوەمــەل هۆڕانــەی چیمــان لــی دەســتینن چــەمان بەدەســتەوەنەماوەمن لــەلایان گــشت ئــەم خڵکــەتکاتان لێدەکــەم دەســتمان لــی هــەڵ گــرن و چیکەئــەزیت و ئازارمــان مــەدەن ... کــابرازۆر تورەبـــو بەقۆنداغـــەی تفەنگەکـــەی

بەتوندی دای لەسنگی حمەلاو وتی ئەگرلەمەزیاتر دەم درێژی بکەیت ئەمجار گولەیەک ئەدەمەناودمتەوە. پاشان ڕوی کردەخڵکەکەووتی یا اللەخێرابن بۆچ ڕاوەستاون بەڕۆن هەرچی هەیەوەدەستان هێناوەبەبێ ماتەڵی بۆمانی بەهێنین . دەیا اللە تاکوهەموتانم بەگولەنەکوشتووە. ئەحمەدکوری مام خاڵند لەناوخەڵکەکەداهاواری کرد ووتی قۆربەسەرتان تەواو بو ڕۆژی مەل هەوری ئمەجاران نیە . بەخووا چاوتان کوێربێ کەس ئامادە نیە هیچ تان بۆبەهێنی باشتر ئمەیەمەلتان بەشکینن و گۆڕتان گوم بکەن . سەرۆکی تاقمەکەلەڕادەبەدربەم وتەیەی ئەحمەد تورەبو تفەنگەی ڕاست کردەوە و گولەیەکی لەناو چاوانی ئەحمەد داومێشکی بلاوکردەوە . ئەحمەدلاوی تازەپێگەیشتو وەخۆشی لەخۆ نەدیو لە ناوخوینی ئالی خۆیداگەوزی . خەڵکەکەهاواریان لی پێدابو ژنان دەستیان کرد بەشین و گریان و قور پێوان وقەژرێننەوە. پیاوەکان هاوارهاواریان لی پیدابو مەشتیان بەرز کردەوە و پیاوانە خۆیان پێشان دا ئەمجارکەس ڕای نەکردو وەخۆیان حەشارنەدا. تاقمەکەچاویان زەق ببووەتفەنگەکانیان ڕوبەخەڵکەکەڕاگرت . یەکیان هاواری کردهەرکەس لەجێگای خۆی بجولێتەوەتەواوی لەشی وەک بێژنگ کون دەکەین .

سوارەخۆی گەیاندەلای کابرای سەرۆکی تاقمەکەوتی

کاکەبیکـــەبۆخاتری خـــوواْ دەســـت لەزۆرداریوکوشـــت و کوشـــتار هـــەڵگرە . ئێـــوەش هاوڕەســـن و هـــاوڕەگزی ئیمـــەن بـــۆچ وآهـــاربونو ئیمـــە ئـــازاردەدن . کـــابراوتی بڕدورکـــەوە ئـــەگینا گوللـــە یـــەک ئـــەدەم لـــەناودەمت . حمـــەلاوڕویتێکردووتی کـــاکی خـــۆم تـــازە بـــەم ئێـــوآرە چیمـــان بـــۆ پەیـــدا نابێـــت و چیمـــان دەســـت ناکـــەوی هـــەتابۆتان بـــە هێـــنن تکـــات لێـــدە کـــەخوین ڕشـــتن بەســـە . تۆبەئیمـــە دەرفـــەت بـــدە . لـــەپاش دەیـــان پـــانزەڕۆژی کەبگـــەڕێوە هـــەرچی تۆبەفـــەرموی ئیمـــە بـــۆت ئامادەدەکـــەین خـــۆت بـــاش ئـــەزانی لەدەســـتی ئیمـــە بـــو ئێـــوە ئازاریـــک ناگـــات ئێـــوە چـــە کوبەدەســـتەو ئیمـــەش لەقوماووهـــەژارین لـــەم حەوتۆداتـــەوآوی کەلوپـــەلی بـــایخ دارئـــەبێن بۆفروشـــتن و پارەکـــەی بۆئێـــوە ئامادەدەکـــەین . لـــەپاش تـــەوآو بـــونی ماوەکەتۆئـــەتوانی بـــەبی هـــات و هـــاوآرو پیاوکوشـــتن بیتـــەوە دڵخوآزیکـــەت کـــەپارەی ئامادەیـــە وەدەســـت بێنـــی . ئیمـــە فـــەرمانی ئێوەلـــە ســـەر چـــاو ئـــەنجام دەدەیـــن . کـــابراوتی بـــۆۆ... دورکـــەوە هـــەتیولام وآیـــە سەربەلـــشتەوەزیادییە. ئـــەگرزۆری لەســـەربڕوی فـــەرمان ئـــەدەم وینـــەیی ئـــەم هـــەتیوە بـــەت کـــوژن . وەلـــەناوخوینی پیـــسی خـــۆت دا بەگـــەوزیی . حمـــەلاو وتـــی مـــن پیـــاوم تـــۆش پیـــاوی قـــەولت پـــیٚ ئـــەدەم ئەگرئـــەمجارە ڕێـــت کەوتـــە ئـــەم گونـــدە بـــە دەســـتی بـــە تـــالٚ نەگەڕێتـــەوە. بـــە قـــولی مـــن باوەڕبکـــە. کـــابرازۆر تـــورە بـــووەک

بـەوری بـەیان گرمانـدی وتـی لـیم دورکـەوە تۆئـەوی مـن بخەڵـەتێنی یـان ئـەوت لـەناو مێـشک دایەلـەم ماوەیـەدا بـەچی ڕاسـپێرەکانی حوکومـەت بڕژینیـەئێرە. حمـەلاو وتـی ناتۆدڵنیابـە ئـەم باسـەلە دەمـی کـەس دەرنایـەت مـن بـەڵینت پـێ ئـەدەم کـە حوکومـەت لـەم مەبەسـتە ئاگارنـەبێت . خەڵکەکـە کـە زۆر بـاش ئـەیان زانـی کەحمـەلاو بـەبێ بیرکردنـەوە قـەول نـادات. تێکـڕا هاواریـان کردقـەولی حمـەلاو قـەولی پیـاوە ئیمـە لەسـەرقەولی ئـەم ڕەفتـار ئەکـەین تۆدڵنیابـە. کـابرازانی ئـەم وتـوویژە بـێ ئەنجامـەخوینی چەندکەسـی کـەش بڕژێنـی چـی دەسـت ناکـەوی . ئـەم جـار بـەدەنگی بـەرز هـاواری کـرد . ئیمـەئیمرو ئـەڕۆین ولەسـەرقەولی ئـەم لاوە وئێـوە حیـساب دەکـەین ماوەپـانزەڕۆژ بـە ئێـوە دەرفـەت ئـەدەین. لـەپاش تـەواوبونی ماوەکەئەگەینـەوە. بەشـەڕەفی خۆمـوو بـاوکم سـوین ئـەخۆم ئەگـەربێتوئێوە بەقـەولی خۆتـان ڕەفتارنەکـەن ویـان ڕاسـپێراوەکانی حوکومـەت بۆئیرەبـەهێنن . قـەراربێت بەقـەراری پیـاوان ئـەم گونـدەژێرو ڕوئەکـەم وگۆمـاوی خـوین بـەدی دەهێـنم . بەکـەس ڕەحـم ناکـەم لـەمناڵی سەربێـشکەهەتاپیری سـەد سـاڵە ئـەکوژم . تـاکو ئێـستازۆرم کاربـەژنان نـەبووە . بـەلام ئـەمجار شـەڕەفو ناموسـتان لکـەدار ئەکـەم . تـەواوی پاتـاڵو ئـاژاڵیش لـەناو ئەبـەم تـاق و لـەژێر گوڵـە دەرناچـەن . کـەس بەزینـدویی نـاهیلم . سـوارەهاواری

کرد وتی ئیمەخۆمان بە پیاو ئەزانین ئەمەی حمەلاو وتی ئیمەرظفتاری پیٚ ئەکەین . کابرا وتی منیش هەرئەمەم ئەویت ئەمجار فەرمانی دا تاقمەکەلەگەماروداني خەڵکەکەدورکەوتنەوە و کابرا خۆی کەوتەپیٚش و ئەمانیش بەشوینی دا لە ناو گوندەکە دەرکەوتن و دور کەوتنەوە . خۆر زەردەیەکی بیٚ هیٚزی مابو هیٚدی لەسەر کیٚوەکانی ئاوایەکەئاوا ئەبو . حمە لاو خۆی گەیاندە سەر تەرمی لاوی خۆشی لەخۆنەدیو و خەڵکەکەش دەوریان گرت حمەلاو وتی باشترئەمەیە بیخینە سەردەست ولەبر هەیٚوانی مزگەوتەکە بی شۆرین و کەفنی بکەین تاکو بەیانی لەناو مزگەوتەکەدا دای بەنیین و بەیانی گۆڕی بۆهەڵ کەنین و بەخاکی بەسپیٚرین . هات و هاوارو شیوەنی ژنان ولاتی داگرتبو. حمەلاو هەمویانی کۆکردەوە زۆری باس بۆکردن هەتائەو کاتەکەگەشتیان دڵیان حەساوەو بیٚ دەنگ بون . ئەمجارپیاوەکان بەم جۆرەی حمەلاو وتی رەفتاریان کرد . ئەمجار گەشتیان بەپکەوە نویژی شیوانیان لەناو مزگەوتەکەدا کردو . حمەلاو مایەوەلەسەر تەرمەکەوخەڵکەکەبڵاوەیان کرد . گەشت بنەماڵە چراکانیان داگیرساندبو . تەنیا ماڵی مام خاڵندی لیقەوماو بو لەبرلەدەست چونی لاوەکەیان لەناو تاریکی دادانیشتبون بەچەپۆک بەسەری خۆیان دائەداو قوریان ئەپیوا... مام خاڵند کەپیاویکی پیرو

کەساس بو فرمیسکی گەرمی بەچاوەکانی دا ئەهاتەخوارو

لەژێرچەنەی بەریشە سپی کەیدا دلۆپ دلۆپ رێژنەی ئەکرد .

جەرگی تەواوی لەتاو کورپە جووانەمەرگەکەی لەت لەت ببو

.بەلام لەبەر ئەمە لەناو خەلکەکەدا پەیمانی لەتەک حمەلاو بەستبو

وەک پیاو پیشی ئەخواردەوە دەنگی دەرنەئەهات . خەلکەکە

لەپاش خواردەنی نان و چایی شەو هەمیسان رێگایان داگرت و

لەناومزگەوتەکە کۆبونەوە و تارایەکی سوریان بەسەر تەرمی

ئەحمەد دا داو تەرمەکەیان لەناوەراستی مزگەوتەکە دانا و

لەدەوری کۆبونەوە داوای عەفۆیان بۆ ئەحمەدی جووانەمەرگ

لەخووا ئەکرد کاتی چاویان بەتەرمەکەوفرمیسکی گەرمی مام

خالند ئەکەوت بەتێکرایی کولۆی گریان دایی ئەگرتن و

فرمیسکی گەرمی بەلاروومەتیان دائەهاتەخوار. حمەلاو

هەستایەسەر پێ ووتی پیاوەبەرێزەکان پیاوە بەشەرفەکانمن

شانازی بەئێوەدەکەم . شانازی بەخوینی ئالی ئەحمەدی

جووانەمەرگ ئەکەم خوینی ئالی ئەحمەد چرای ئازادی و

سەربەستیە بۆئیمە ئەم خوینە ئەبێتە هۆی یەک گرتن ویەک

گرتویی بۆ ئیمەو تەواوی ناوچەکە ئەبێتە ریگای رزگاری لەژێر

پیلاوی ئەم تاقمە نامەردو ناپیاوانە شانازی بەمە ئەکەم کە ئیمرو

ئێوە وەک پیاو وەک پالەوان وەک شێرلە برامبەری دژودوژمن

دا ڕاوەستان و خۆتان حەشار نەدا تەرسو خۆف بەدڵو دانەهات و تەرسو لێی جیابۆوە لەبەرامبەر ئەم بێ شەرم و بێ ئابڕۆوانە ڕاوستان گەشتمانباش ئەزانین وەدەست هێنانی ژیانی بێ ترس و پارێزگاری لەشەرفوو ئابرو ئەبێت لەئاستی ئەم جۆرە ناپیاوانە ڕاوە ستین . ئەبێت خوین بەڕژی مەگەرنەتان بیستووە دەڵین داری ئازادی بەخوین ئاودەدری. بۆیە ئەمشەو ئیمە لیرە لەدەوری ئەم لاوەژاکاوەئەم لاوەلە خوین گەوزاوە کەبۆ ئیمە بۆ تە چرای ئازادی کۆبوینەوە تاکوبەلەین بەیەک بەدەین وەبەخوینی ئەم شەهیدە سوین بخۆین هەتاتۆڵە نەستینین و حەقی ژیانی بە بێ ترس لەم ناپیاوانە بەدەستی خۆمان نەستینین پاشە کشە ناکەین ئیتر سەر کەوتویی هەمولایەک لەخوای گەورە داوادەکەم . سوارە هەستا ووتی براکان لەبرئمە ماوەکە کەمە و لەپاش ئەو ماوەیە هەمیسان هێرش ئکەنەسەرمان ئەمجار خووانەکردەبەسەرمان دادەن تاقمان ناهێڵن قاسەم ووتی بە هۆمیدی خووا قاچیان ئەبڕین وبۆدایم سیبەری ڕەشیان لەسەر خۆمان و ناوچەکەلادەدین . حمەلاو وتی براکان سەر شۆڕی مەل کەچی بەس نیە کاتی ئمە نەگەیشتۆوە کەلەخۆمان و ژن و منالە بێ تاوانەکان پارێزگاری بکەین . مام ڕەحمان هاواری کردو وتی ڕاست ئەکا براکانم تاکەی مەل کەچ و سەرشۆڕبین بەخووامن

کەتەمەنم بەشست ساڵ گەیوە. تفەنگ هەڵ ئەگرم و وڵامی گوللە بەگوللەئەدەمەوە ئەگەر کەسم لەگەڵ نەبێت تەنیا خۆم بەرگریان لێدەکەم خەڵکەکە کەتێکڕا هاواریان کرد. بۆچ مام ڕەحمان مەگەر ئیمەش پیاونین ؟ مەگەر ئەم نەگبەتی و کلۆلی مەلی ئیمەشی نەگرتووە . بەخوواهەرکەس هاوکاری نەکات پیاونیە . ئەمجار کاک عوسمان هاتە جواب ووتی گەشتمان ئامادەین چەک هەڵگرین و پارێزگاری لەناموسو شەرەفی خۆمان بکەین . کاک عوسمان وتی من دارتاشم لەباوک و باپیرم دەروست کردەنی قالۆری تەفنگ فیربوم . ئەگەرئێوە کەرەسەکانی کەی پێدا بکەن ئەتوانم لەماوەی پینج شەش ڕۆژدا پانزدە تا بیست قالوری تفەنگ دەروست بکەم ئەگەردو کەس یارمەتیم بدات لەلەوماوەیەدا منیش پانزدە بیست لولەو چەخماخ ئامادەدەکەم . خەڵکەکەزۆریان پێخۆش بو . هەمویان بەڵینیان دایارمەتی کاک عوسمان و کاک مەحموود بەدن . کاک ڕەئوف وتی :« منیش ئەچم بۆ شار، ساچمە و کەلوپەلی پێویستی ئەکرم» ئەو شەو تا کاتێکی درنگ هەمویان دانیشتن و وتوویژ و گەڵاڵەی کارەکانیان کرد. کاک قەرەنی وتی :« ئیمە ئەمشەو نان خوواردنمان لە بیر چۆتەوە چەند کەسێک بچنە ماڵی ئیمە و نان و پێوستی بەهێنن تا کو شتیک بەخۆین» . حەمەلاو بە خووا من

نازانم بە چە زوانێک لە پیاوەتی و ئازایەتی ئێوە سوپاس بکەم، لەوانم بەلێن بەم جووانە مەرگە بەدەم هەموومان بە یکەوە تاوانی مەرگی لەم تاقمە ناپیاوانە ئەستێنین.» قاسم وتی :« ئەرکی سەرشانی هەمومانە کە ئەم کارە گرینگە بە ئەنجام بەگەینین» سوارە روی کردە مام خاڵند و وتی :« مامە گیان خەمناک مەبە ئیمە گەشتمان ئەولادی تۆین، تۆش ئیمە بە کوڕی خۆت قەبول بکە، تەواومان وەک تۆ بەکارەساتە خەمناکین» بەیانی کاتی زەردەی خۆر دەرکەوت ڕۆژ ڕەشای شەوی لادا، جێگای خۆی لەسەر زەوی ئەکردوە، خەڵکیکی زۆر لەبەر هەیوانی مزگەوتەکە کۆببونەوە و تەرمی پاکی ئەحمەدیان خستە سەرشان و بەر و گلکۆی دیاری کراو بەردیان و ترمەکەیان بە گۆڕی تەنگە و سارد ئەسپارد، لەسەر گۆڕەکە سر خۆشیان لە مام خاڵند کرد و گڕانەوە بۆ مزگەوت، خەڵکی ئاوایی دەورو بەر کە ئەم مەبەستیان بە گوی گەیشتبو زۆریان بۆ سەرەخۆشی هاتن بۆ کێوەسور، ئەمانیش لە ناو مزگەوتە کەدا پیمانیان بەست کەچەک هەڵگرن و وەک پیاوان بۆ لە ناو بردەنی ئەم تاقمە زۆردارە، شان بە شانی دانیشتوانی ئاوایی کێوەسور بەربەرەکانی بکەن، چوار کەسی کەش بۆ پێک هینانی کەرەسەی دەروست کردنی تفەنگ خۆیان هەتا پاش نیوەڕوی خایاند، میوانەکان خووافیزیان کرد و بەر و

ئاوایەکانی خۆیان کەوتنەڕێ بەڵام چوار کەسەکە مانەوە، ئەوانیش لەگەڵ کاک مەحموود ڕویشتنە کارگاکە و دەستیان کرد بە دروست کردنی قالۆری تفەنگ کاک عوسمان و دو سی کەسی کەش لە ناو کارگەی ئاسنگەری دەستیان کرد بە دروست کردنی لولەو چەخماخی تفەنگەکان، کاک ڕەئوف لەگەڵ قاسم کەوتەری بۆ چونی شاری هەتاکو بیانی زو کەلوپەلی پیویستی و لازم وە دەست بەهێنن و زو بگەڕێنەوە.

لە بەر ئەمە بە دڵگرمی شەو و ڕۆژ خەریکی ئیش و کار بون لە ماوەی حەوتویەک دا بیست و پینج تفەنگی ڕێک و پێک و بێ عەبیان دەروست کرد و ئامادەیان کرد لە ناو مزگەوتەکەدا ریزیان کرد وە ئەو کەسانە تەمەنیان گوزراند بو و لە هاویشتنی تفەنگ ئاگادار بون و چالاکی زۆریان هەبو بیانیان ئەچونە ناو مزگەوت و لەتەک لاوەکان کۆ ئەبونەوە و فیریان ئەکردن و هەمو ڕۆژی لە پاش نویژی ئیوارە چەند تفەنگ و کەرەسەی پیۆیستیان هەڵ ئەگرت و لەگەڵ لاوەکان ئەڕویشتن بۆ دەرەوەی گوندەکە و هاویشتنی تفەنگیان فیری لاوەکان دەکرد و ئامادەیان دەکردن بۆ بەربەرەکانی لەگەڵ دژی ناپاک و لە خە بوردن بۆ ژیانی سەربەستی ڕۆژی دەهەم بو لە دورەوە بۆرە سواریک دەکەوت، دیار بو کە بە پرتاو بەرو ئاوایی کێوەسور دیت، لاوەکان کە خۆیان

ئامادە کردبو و هۆشیار ڕاوەستابون، خەبەریان بۆ حەمەلاو برد و چونیتی چاو پێکەوتنی سوارەکەیان بۆ باس کرد، حەمەلاو خەڵکەکە لە ناو مزگەوتەکە دا کۆ ببۆنەوە، سوارەکە، گەیشتە ناو ئاوایەکە لە ناو گۆڕەپانەکە ڕاوەستا، ڕای سپارد کە حەمەلاو بێت بۆ لای بەڵام حەمەلاو وڵامی بۆ نارد ئەگر کاریکی هەیە بێت بۆ ناو مزگەوت، تا کو وتوویژ بکەین، کابرای سوارە زۆر تورە بو دو گوللەی تەقانەو و وتی حەمەلاو بەم پلەیە گەیشتووە من بەچەم بۆ لای، وڵاخەکەی تاو دا و تا گەیشتە بەر هێوانی مزگەوتەکە، هاواری کرد حەمەلاو، حەمەلاو بۆچ خۆت حەشار داوە خۆت پیشان نادەیت؟ دو سی کەس ڕاست بۆنەوە هەڵمەتی بۆ بەرن بەڵام حەمەلاو پێشی گرتن و وتی خۆ ڕاگرن حەمەلاو هاتە بەر هێوانی مزگەوتەکە و وتی :« برام زۆر بەخیر بێت لە بەر چی نایتە ژورەوە ئیرە مزگەوتە و ماڵی خووا، ورە وتوویژ بکەین، » سوارەکە بە تورەیەوە وتی :« مزگەوتی چی و وتوویژی چی؟ مەگر نازانی من لە لایان کاک شیرکۆ وە هاتوم بۆ باج ورگرتن زوکەن چی تان ئامادە کردووە بە زویی بۆم باری ئەم وڵاخە کەن هەتا لەگەڵ خۆم بۆ خزمەتی کاک شیرکۆی سەروکی گەورەم بەرم.» حەمەلاو وڵامی دایەوە و وتی :« بە کاک شیرکۆ بەڵیی هیچ مان بۆ جور نەکردووە و لەم و لاش باج نادەین،» سوارەکە وتی :« ئەمە دم

دریــــژی ئەکــــەیت ســــویند ئــــەخۆم ســــەزای ئــــەم دم دریــــژی و نافەرمانیــــەت پێــــشان ئــــەدەم، مــــەگر هــــەتیو ئیــــوە ژێرپــــار و ژێردســــتی ئیمــــە نیــــین، چــــۆن ئــــەتوانن نافــــەرمانی لــــە فــــەرمانی کــــاک شــــیرکۆ بکــــەن و ... مــــەگر شــــیت بــــون» قاســــم وتــــی :« بــــە ســــەری بــــاوکی تــــۆش و شــــیرکۆ ناپیــــاو، کــــاتی زۆرداری و مــــل هــــووری تــــەواو بــــو» ئــــەمجار ســــوارە وتــــی:« ڕۆژی زۆرداری و مــــل هــــوری شــــیرکۆی نــــامرد و تاقمــــە ناپیاوەکــــانی نــــەماوە بەســــەر چــــو ئــــەمجار ڕیگاتــــان بکەویتــــە ئیــــرە بــــەدار و بــــەرد و تیلــــا، دم و دەدانتــــان ئــــەهاڕین، ڕوتــــان ڕەش ئەکــــەین » کــــابرا روی کــــردە ســــوارە و وتــــی :« ئــــەوە کــــاتی مــــەرگت گــــەییوە ئــــەزانی لەگــــەل کــــی بــــاس ئەکــــەی پلــــە مــــاری تفەنگەکــــەی دا کــــە گوللەیــــەک لــــە ســــوارە بــــدات، بــــەلام قــــادری کــــوری مــــام ڕەســــول هەلمــــەتی بــــردە ســــەر ســــوارەکە و لەســــەر زینــــی ولاخەکــــە دایبەزانــــد و ســــواری ســــنگی کــــابرا بــــو، خەنجەرەکــــەی لــــە کــــالان درکیــــشا و ئاوقــــای ملــــی کــــابرا بــــو .. وتــــی :« نــــامرد ڕۆژی زۆرداری و ناپیــــاوی نــــەماوە ... » حەمــــەلاو هــــاواری کــــرد :« قــــادر نکــــەی دەســــت ڕاگــــرە، ملــــی نــــەبڕی » قــــادر وتــــی :« حەمــــەلاو وازبینــــە بــــە خــــووا ئــــەی کــــوژم ســــەری ئــــەبڕم و تەرمــــە پیــــسەکەی بــــۆ شــــیرکۆی نــــامرد ئەنیرمــــەوە» حەمــــەلاو هــــاواری کــــرد ... بــــەلام قــــادر وچــــانی پینــــەدا و خەنجەرەکــــەی پــــی داهینــــا و گویچەکەیــــەکی بــــری و دایــــە دەســــت کــــابرا و وتــــی :« ناپیــــاو لــــە بــــەر

فـەرمودەی حەمـەلاو سـنگتم لـەت نـەکرد، ئـەمجار خـووا بـەت کـات بـە قوربـانی حەمـەلاو ئەگـەنا بـە خـووا لـە پـاش سـنگت قورکـە پیسـەکەشتم هـەڵ ئـەبڕی» کـەریم کـە لـەلای شـانی قـادر ڕاوەسـتا بـو پـەلا مـاری دا و تفـەنگی کـابرای لـە چـەنگ درهینـا و دوکـوتی کـرد و قاڵورەکـە بـە دو کـوتی دایـەوە دەسـتی کـابرا حەمـەلاو وتـی :« قـادر تـەکات لـی ئەکـەم لەسـەر سـنگی هەڵـسته» کـاتی قـادر لەسـەر سـنگی کـابرا جیـا بـۆوە، کـابرا هەسـتایە سـەر پـیێ چـاوی بـە خـوین کـەوت و چـاوی بـە گویچکـەی بـڕاوی لـە نـاو مەشـتی دا بـو، کـەوت سـەری سـۆڕما لـە پـاش ماوەیـەک کـە هۆشـی هاتـەوە بـر خـۆ، هـاواری کـرد :« حەمـەلاو ... حەمـەلاو و مـن ... خـوارد فـەرمان بـدە لـیم ببـورن بـە خـووا مـن بـێ تـاوانم. ئێـستاش هـەرچی بەفـەرمون ئـەگر ئیـزن بـەدن بگەڕیمـەوە بـە شـیرکۆ ئـەڵیم، تکـا ئەکـەم لـە تـاوانی مـن بـە بـوورن» حەمـەلاو وتـی :« ئیمـە موسـوڵمانین و خـووا ئەپەرسـتین ڕازی بـە خـوین و خـوین ڕشـتن نـین، بـەڵام ئـەگر شـیرکۆ و تاقمەکـەی زۆرمـان بـۆ بـەهێنن و دەسـت لـە مـل هـوڕی و زۆرداری هـەڵ نـەگرن، ئیمـەش وەک پۆڵـا لـە بەرانبـەری دا ڕادەوسـتین و چـی کـە سـەر دانـاخین، زۆر بـاش شـیرکۆ حـاڵی کـە، بێتـو ئـەمجار هیرشـمان بـۆ بـەهێنی و داوای بـاج بکـات بـە یارمـەتی خـووا تـاق و لـی نـاهیلین» ئـەمجار حەمـەلاو تـۆزی زاخـاوی هێنـاو کویچکـە

براوەکەی کابرای برژاندەوە و تیماری کرد و تفەنگە شەکاوەکەی دایە دەست و سواری وڵاخەکەی کرد و ڕوانەی کردەوە. قادر هاواری کرد و وتی :« هۆی کابرا ناوت نازانم بەڵام ئەگر ئەمجار ڕێت بکەویتە ئێرە بە خووا سەرت ئەبڕم» کابرا وڵامی نەدایەوە، سەری داخست و ڕۆیشت، بەشیکی زۆر لە لاوەکان بەم کارەی حەمەلاو زۆر ناڕازی بون، لە بەر ئەمە مەڕامی ئەوان ئەمە بو کابرا بکوژن و تەرمەکەی بۆ شیرکۆ بنیرنەوە، حەمەلاو ڕویی کردە خەڵکەکە و وتی :« من ڕۆژی هەولێش وتم ئیمە بە فەرمانی قورعان ڕەفتار دەکەین، ئەم کابرایە تەنیا بو،جا بۆ ئیمە پیاوەتی نەبو تا کو بیکوژین» کاتی گەشتیان چونە ناو مزگەوتەکە و کۆبونەوە مام ڕەحمان وتی :« حەمەلاو گلاڵەت چییە، ئیمە چی بکەین » حەمەلاو وتی :« ئەبێ ئیمە هۆشیار بین ئێستا شیرکۆ وەک بەوری بیان زامدارە، ئیمرو یان بەیانی خۆی و تاقمەکە هەڵمەت ئەکەنە سەرمان، ئەگەر ئیمە بەمان هەویی بەسەر بەستی و ئازادی بژین شەڕی ئەم تاقمە ناپیاوانە لە سەر خۆمان و ناوچەکەمان لادەین و بە ئامانج و ئاواتی خۆ بگەین» سوارە وتی :« حەمەلاو بوچ پیچ و پەنا ئەڕویت زۆ پیمان بەڵی تاکو ئیمەش بزانین» حەمەلاو هەستایە سەر پێ و وتی:«براکان ئیمە ئێستا بیست و پینج تفەنگمان هەیە، لەم لاشەوە چەند جار هاوارمان بو

حوكومەت بەرد و نامیلەكان بۆ نوسین بەڵام هیچ وڵامی ندراینەوە كەواتە ئەبێ خۆمان لەسەر پێ خۆمان ڕاوەستین و پارێزگاری لە خۆمان و ناموس و شەرەفی خۆمان بكەین خۆشتان ئەزانن شێركۆ و تاقمەكەی دوانزە كەسن، گڵاڵەكەی من ئەمەیە ئەوكەسانە وا دەست بە تفەنگیان باشە سی كەس لە پەشتی قەڵاخەكان وە دامەنی كێوەكە و وە لە بن بەردەكانی دەورو بەر بە بێ دەنگی خۆیان حەشار بدەن و تفەنگ بەدەست و ئامادەبن، هەتا شێركۆ و تاقمەكەی ئەكێشینە ناوە ڕاستی گۆڕەپانی ئاوایەكە من كاریكی وەها ئەكەم كە بە تەواوی تاقمەكە بكەونە ژێر دەستی تفەنگ هاویژەكانی خۆمان ئەمجار من ئەچەم وتوویژ لەگەڵ شێركۆ و تاقمەكە ئەكەم ، ژن و منالەپچوكەكان و مروڤە پیرەكانیش لە ماڵەی خۆیان دابین بكەن و بە هیچ جۆر خۆیان پێشان نەدەن ئەگر وتویژەكەمان بە ئەنجام نگەیشت من دەستەكانم بەرز ئەكەمەوە و ئێوەش لە هەر چوار لاوە وچانیان پێ مەدەن و دەست ڕێژیان لی بكەن ... فەقەت تكا ئەكەم دەست و نەلەرزی نیشان باش بگرن و تەواویان بو دایم لە ناو بەرن ئەگر تاقەیان بەمێنی هەمیسان سەرهەڵ دەدەنەوە وەك گەیا شین ئەبنەوە» قاسم هاواری كرد:«حەمەلاو تۆ چی ئەكەیت» حەمەلاو وتی :« لە پاش ئەوە من دەستەكانم بەرز

کـردەوە ئێـوەش لـە پـڕدا دەسـت ئەکـەن بـە تەقـە منیش گـۆرج خـۆم بـە سـەر زەوی دا ڕائەکیـشم، ئـەوانیش کـە سـوارن و لـە تـاو تەقـە تـەق هۆشـی مـەنیان نابێـت، ئـەمجار بـە جۆریـک خـۆم ڕزگـار ئەکـەم، هەمیـسان دوپاتـەی دەکەمـەوە ئـەگر مـن مـردم ئیـوە نابێـت وچانیـان پێبـەدەن گـەمارویان دەن و تاقیـان لـی ببـڕن» کـاک ڕەئـوف وتـی :« ئەگـەر خـوای نـەکردە تـۆ کـوژرای چـی؟ » حەمـەلاو وڵـامی دایـەوە و وتـی:« خەفـەت بـۆ مـن مـەخۆن لـە بـەر ئەمـە ئێـستا لـە سایەی خـوا ئیـوە بـاش ڕون بونـەوە و مانـای ژیـانی سـەر بەسـتی ئـەزانن ئەگـەر مـن کـوژرام وسـیەتی مـن ئەمەیـە، یـەک گرتـوبن هـەرگیز لەیـەک جیـا مەبنـەوە، بـۆ یـەک وەک بـرا بـن بـە فـەرمانی خـوا و قورعـان ڕەفتـار بکـەن وە لـە خیـر و خۆشـی و شـین و شـادی یـەکتر دا بەشـدار بـن، زۆر دەربەنـدی دونیـا مـەبن، یارمـەتی هـەژاران و لیقومـاوان بـەدن، هـەتا خـوا لـە دونیـای کـە ، کـە جێگـای ژینـی ڕاسـتەقینەیە، چاکـە و خـەڵاتی باشـتان پـی بـدات لـە بـەر ئەمـە خـوا ئیمـەی بـەدی هێنـاوە ژیـان و نـەمانی گەشـت زینـدەواریک بـە دەسـت ئـەوە. لـە پـاش مـن سـوارە و قاسـم هـەن، ئـەمانیش ڕوشـن بیـرن، ئـەمانیش ماموسـتایەکی تـەواون جێگـای مـن ئەگرنـەوە، منالـەکان بخەنـە ژێـر دەسـتیان هـەتا فیـری زانـست و زانیاریـان بکـەن هـەتا دونیـا هەیـە چـرای زانیـاری ڕۆژ لەگـەڵ ڕۆژ ڕونـاکتر ئـەبێت، هـەرگیز ناکۆژێتـەوە،

من لە هەموتان تکا ئەکەم بەتایبەت لە سوارە و قاسم ئەگەر من کوژرام تەرمەکەی من لە ژیر دارە مازو پیرەکە کە رۆژی هەوەڵ لە ژیری دانیشتین و پیمانمان بەست بەم نیژن و بە خاکم بسپیرن» کاتی حەمەلاو ئەم وتوویژەی لەگەڵ خەڵکەکە ئەکرد تەواویان ئەگریان و فرمیسکی گەرمیان بە چاوەکاندا ئەهاتە خوار، کاک رەحمان وتی :« حەمەلاو تۆ گەنجی، تۆ لاوی، تۆ چرای رۆناکی ئاوایی ئیمە و ئەم ناوچەیەی ـ فرمیسکی ئەرژاند و ئەی وت ـ بە هومیدی خووا ئەم چرایە ناکوژیتەوە ساخ و سەلامەت ئەبی، لە پاش تەواو بونی ئەم تەنگەو چەلەمەیە، ئینشاالله زماوەند بۆتۆ و سوارە و قاسم پیک ئەهینین حەوت شەو و حەوت رۆژ بەزم و شادی ساز ئەکەین» حەمەلاو وتی :« زۆر سوپاس لە هەمو لایەک ئەکەم با بزانین خووا چۆنی رەزا لە سەرە» لە پاش تەواو بونی وتوویژە کە بانگی نیوەرۆ دەستی پیکرد و بە تیکرایی نویژیان کرد. ئەمجار نانی نیوەرۆیان خوارد و هەتا ئیواریکی درنگ لە ناو مزگەوتەکە کۆبونەوە و ئیوارای ئەم چەند کەسەی دیاری کرابون تفەنگەکانیان لەگەڵ کەلوپەلی پیویستی پی درا و لە پاش ئاموژگاریکی باش رۆیشتن بۆ شوینەکانی دیاری کراو ... ئەم رۆژ تاکو شەو هیچ روداوەیەک روی نەدا شەویش هەر بەم جۆرە تیپەری، بەیانی زۆر زو

خەڵکەکە لە ناو مزگەوتەکە دا چۆن پیار و دیاری کرابو بەم جۆرە کرداریان کرد، تەواوی خەڵکی ئاوایی کێوەسور خۆیان ئامادە کردبو، خۆر بە تەواوی نگەیشتبو نیوەی ئاسمان لە دورەوە تەپو تۆزیکی زۆر پەیدا بو، هات و هاوار لە ناو گوندەکەدا بڵاو بۆوە، خەڵکەکە هەر وەک عەسکەری دورەدیتو هەر کەس لە جێگای خۆی دامەزران، لەم کاتەدا زرمە زرمی قاچی وڵاخەکان لەگەڵ حیلەحیلیان بە گوی ئەگەیشت، تاقمەکە نیزیک بونەوە کەیان گەیشتە ڕادەیەک کە بە تەواوی بە چاو ئەبینران، شیرکۆ وەک بەوری زام دار کەوتبۆ پیشەوە ... سوارەکانی کەش بە تاقم لە دولاوە بەپەلە وڵاخەکانیان تاو ئەدا، ماوەیکی زۆری نەخایاند گەیشتنە هەوەڵ کۆڵانی ئاوایەکە، قاسم و دو کەسی کە لەبن کادێنیک خۆیان حەشار دا بو چاویان بە تاقمەکە کەوت، لە لای چپەوەش سوارە لەگەڵ دو لاوی ئازا لە بن بەردیکی گەورە خۆیان مات دا بو، تفەنگ بەدەستەکانی کەش لە دەوروبەری میدانەکە زۆر جووان خۆیان حەشار دا بو و بەسەرمیدانەکە دا زاڵ بون، کاتی شیرکۆ و دارو دەستەکەی گەیشتنە ناو دێ، دەستیان کرد بە تەقە تەق و هات و هاوار و گوللەیکی زۆریان تەقاند. حەمەلاو و چەند کەسێکی کە ناو مزگەوتەکەدا بتەواوی ئامادە بون کابرا سوارە گوی براوەکەش شان بە شانی تاقمەکە

لەگــەڵ شــیرکۆ بــۆ پێــشەوە ئــەهات، شــیرکۆ دەســتی کــرد بــە هــاوار هــاوار و جنیــوی دەدا و هەڕەشــەی دەکــرد ، وتــی :« ئیــوەی نــامرد گەیــشتونە ڕادەیــەک ئەتــەک بەڕاســپێراوی شــیرکۆ دەکــەن، ئەگــەر مــەردن و ناترســین بــۆچ خۆتــان پێــشان نــادەن ــــ هــاواری کــرد ــــ حەمــەلا ... حەمــەلاوی ناپیــاو تــۆ بــەم جیگایــە گەیــشتوی فــەرمان بــەدی گویچکــەی پیــاوی مــن ببــڕن وە بــەبێ بــاج بۆمــەنی ڕوانــە ئەکەیــەو...» کــابرای گــویی بــڕاو وتــی :« کــاک شــیرکۆ ئــە بیــت لــە نــاو مزگەوتەکــەدا خۆیــان حەشــار دابیــت» شــیرکۆ وتــی :« مزگــەوتی چــی؟ بــە فــەرمانی کــی مزگــەوتیان دروســت کــردوەو» ئــەمجار شــیرکۆ و ســوارەکانی بــە پلــە خۆیــان گەیانــدە بــەر هیــوانی مزگەوتەکــە، شــیرکۆ هــاواری کــرد نامردینــە بــۆچ وەک ژن خۆتــان حەشــار داوە و خۆپیــشان نــادەن، لــە نــاو مزگەوتەکــە دو ســی کــەس هەســتانە ســەر پــێ و هیــرش بــەرن بــۆ شــیرکۆ بــەڵام حەمــەلاو پیــشی گــرتن و خــۆی هاتــە دەرەوە و وتــی:« کــاک شــیرکۆ ئــەم هــاوار هــاوارەت لــی چییــە؟ چیــت لــە گیــانی ئیمــە دەوی؟ بــۆچ دەســتمان لــی هــەڵ نــاگری؟» شــیرکۆ وتــی :« نــامردی ناپیــاو مەگــەر تــۆ قــەولت نــەدا دە ڕۆژت مــاوە بــدەم لــە پــاش دە ڕۆژەکــە باجەکــەم بــۆ کۆبکەنــەوە و بــۆم ئامــادە بکــەن، حەمــەلاوی نــامرد وەک بیــستومە تــۆ بویتــە دەم ڕاســتی ئــەم گونــدە، مانــای ئەوەیــە خــۆت زۆر پــێ پیــاوە هــی ناپیــاو ...» حەمــە لاو

بە دڵی داهات ئەگەر وەڵامی توندی بداتەوە هەر لێرە ئەی کوژێت باشتر ئەوەیە بە هەر جۆرێک بێت بیانکێشیتە ناو میدانی گوندەکە، ئەمجار ڕوی کردە شێرکۆ و وتی :« تۆ بە ناحەق جنیو دەدی تو وەتوڕە بویت خۆت زیورمەکە من تەنیا چەم لە دەست نایەت وەرە بڕۆین لەگەڵ خەڵکەکە وتوویژ بکەین ئەوانیش هەر وەک تۆ پیاون » شێرکۆ وتی :« کەس بەدەروە نییە تەواویان وەک ژن خۆیان حەشار داوە من هیچ کام لەم ناپیاوانە وەبەر چاوم نایەت.» حەمەلاو وتی :« تەواویان لە ناو گۆڕەپانی ئاوایەکەن پیم سەیرە تۆ چاوت پێ یان نەکەوتووە» حەمەلاو کۆتە پێش و شێرکۆ و پیاوەکانی بە شوین خۆی دا ڕاکێشا هەتا گەیشتنە ناو میدانەکە شێرکۆ وتی :« ئەمانیش وەک تۆ ناپیاون ئەی کووان بۆچ وەک ژن خۆیان حەشار داوە من کەسی نابینم» حەمەلاو وتی :« قەول بو هەمویان لێرە کۆببنەوە، هەڵبەت پیاون شەرەفیان هەیە باج و مل هۆڕی بە ناپیاویکی وەک تۆ نادەن ...» شێرکۆ وتی : « تۆش لەگەڵ گەشتیان خەڵەت ئەکەی ئەم ناپیاوەی گویچکەی ئەم پیاوەی منی بڕیوە ئەبێت خۆی پێشان بدات هەتاکو دو گوللەی بەدەم لە ناو دمی ئەگەر بێتو خۆی پێشان نەدات سویند بە ڕوحی باوکم ئەخۆم لەجیاتی ئەم گویچکەیە، بیست کەس ئەکوژم» حەمەلاو وتی:« کاک شێرکۆ

بیکــە بــۆ خــاتری خــوۆا و پیــاوی تــۆ ئــادەمیزادی ، دەســـت هــەلگرە لــە پیاوکوشـــتن و خراپــە و بــاج وەرگـــرتن لــەم خەلکــە هــەژار و بــێ دەســـەلاتە. هــەتا کــو گــۆمی خــوین پیــک نــەهاتووە» شــیرکۆ لــە وتــەکانی حەمــەلاو زۆر ئــالۆز و تــورە بــو لەقەیــەکی لــە ســنگی حەمــەلاو دا و تاقمەکــە دەوری شــیرکۆیان گــەمارو دا. حەمــەلاو وەک پیــاو راوەســـتا و هەمیـــسان لــە بــەر شــیرکۆ پاڕایــەوە . وتـــی : « شــیرکۆ لــە نــاو خەلکەکــە یەکــەتی پیــک هــاتووە تــەواویان یــەک گرتــون و بــە خــوۆا چــاوت ســپی بــێ بــاج نــادەن و تــۆش چــت دەســت ناکــەوەی» شــیرکۆ زۆر تــورە بــو وتــی : « حــەرام زادە لام وایــە تــۆ ئــەم خەلکــەت هــان داوە و پیکــەوە ریکــت خەســتون هــەر چیــک بیــت لــە ژیــر ســەری تــۆ دایــە» حەمــە لاو وتـــی : « زەمــانی مــل هــوری و بــاج گــرتن تــەواو بــووە وەک پیــاو ریکــا بگــرە و خــوت و ئــەم پیاوانــەت بــە کوشــتن مــەدە» شــیرکۆ وتــی : « مــن مــاوەی پــانزە ســالە لــەم ناوچەیــدا بــاج دەســتینم، کــەس نــەتوانیوە لــە برانبــەری شــیرکۆ دا راوەســـتی و دەم دریــژی بکــات، بــە خــوۆا تــەواوی ئــەم گونــدە ئــاگر تیبــەر ئــەدەم و هــەتا بــە ژن و منــالی سەربیــشکەش رەحـــم ناکــەم» تفەنگەکــەی لــە شــانی جیــا کــردەوە و وتــی : « هــەتا ســی ژمــارە ئــەبژیرم ئەگــەر ئــەم ناپیــاوە خــوی پیــشان نــەدا هــەوەلین کــەس تــۆ دەکــوژم» تــەواوی

سـوارەکان لـە هەڕەشـەی شـیرکۆ ڕەق ڕاوەسـتان و پەشـویان لـی بڕابو.

شـیرکۆ دەسـتی کـرد بـە ژمـاردن :« یـەک ...» لـەم لاوە تـەواوی چـەک بەدەسـتانی ئـاوایی کێوەسـور چـاوەڕوانی فـەرمانی حەمـە لاو بـون. قاسـم لـە پنـاوە لەبـەر خـوا ئـەپاڕاوە کـە ئەمامڵەیـە پێـک بێـت و خـوینی کـەس نـەڕژیت. سـوارە لـە بـن بـەردە گەورەکـە کـە چـاوی لـە شـیرکۆ و حەمـەلاو بـو خەفـەتی ئەمـەی ئـەخوارد کـە نـەی ئـەزانی شـیرکۆ و حەمـەلاو باسـی چـی ئەکـەن. یـەک دو جـار ویـستی هـەوەڵین گوللـە لـە تـوقی سـەری شـیرکۆ بـدات بـەڵام دەسـتی گێـڕاوە و چاوەڕوانی فەرمانی حەمەلاو بو.

شـیرکۆ بـەدەنگی بـەرز وتـی : « دو... » ماوەیـەکی بـە سـەر چـو ڕاوەسـتا لەسـەر وڵاخەکـەی وتـی : « سـی ... » تفەنگەکـەی ئامـادە کـرد بـە تەواوبـونی ژمـارە سـی حەمـەلاو هـەر دو دەسـتەکانی بـەرز کـردەوە و بـەڵام شـیرکۆ هـەوەڵین گوللـەی لـە نـاو چـاوانی حەمـەلاو دا. حەمـەلاو بـە زەوی دا کـەوت. ئـەمجار لـە هـەر چـوار لاوە پیـاوە شـیرەکان دەسـت ڕیژیـان لـە تاقمـە کـە کـرد و هـەر وەک گـەنم بـەدەمی داسـەوە دەروانـنـەوە. قاسم هـەوەڵین گوللـەی ڕاسـت لـە تـوقی سـەری شـیرکۆ دا لـە سـەر زینـی وڵاخەکـە شـیرکۆ بـە دمـەوە کەوتـە سـەر زەوی، لـە ماوەیـەکی کـەم دا تاقیـان لـی بـڕین و هـیچ

کامیان زیندو نەمان ئەمەی بەحال تۆی گیانی مابو گوللەیەکیان لە توقی سەری ئەدا و ئاسودەیان دەکرد، تەواوی خەڵکەکە لە حەشارگاکان ڕژانە دەرەوە خۆیان گەیاندە سەر تەرمی بێ گیانی حەمەلاو، سوارە هاواری کرد : حەمە لاو ... حەمە لاو ... بە چەپۆک بەسەری خۆی دا دەداو دەستی کرد بە شیوەن و گریان، حەمەلاو بە هەوەڵین گوللەی شیرکۆ گیانی پاکی لە دەست دابو، لە ناو خوینی ئالێ خۆیدا گیانی دابو، چاوەکانی کرابووە چاوی لە ئاسمانی پان و برین بڕیبو، هەر خووا ئەزانی لە کاتی گیان دان دا چی بەدم دا هاتبو بێ گومان هەر ناوی خووای بە دم دا هاتووە خەڵکەکە بە تێکڕایی بە سەری خۆیان دا دەدا و دەستیان کرد بە شیوەن و گریان و ڕو ڕوی ژنان پەیدا بو تەواویان قژیان ئەڕنیوە و سەر و چاوی خۆیان بە نینوۆخ زامدار کرد و خوینیان بەلا ڕومەتەکانیان دا ئەهاتە خووار، شیوەن و گریان تەواوی میدانەکەی داگرتبو، سوارە کە لەسەر تەرمی پاکی حەمەلاو ڕاوەستا بو چاوی بە خوینی ئالێ حەمەلاو کەوت، تامایەکی ڕەشی بەبەر چاو دا هات و دونیا لە بەر چاوەکانی تاریک بو، موچورکیکی توندی بە تەواوی لەشی دا هات و سرمایەکی زۆر کەوتە ناو لەشی ڕەنگی بزرکابو، لە پڕدا دەستی کرد بە پێکەنین پڕ بە دم قا ... قای دەکیشا و هاواری دەکرد : براکان ...

خۆشـــكەكان ... ئەمـــە ... ئەمـــە حەمـــەلاوە ... حەمـــەلاو ... ئەمـــە چـــرای ڕونـــاكی ناوچەكەمانـــە وا بـــێ نـــاز لەســـەر زەوی كـــەوتووە لـــە خـــوێنی خوێـــدا گـــەوزاوە. ئـــەمجار خـــۆی بەســـەر تەرمەكـــە دا ئەكێـــشا و خـــوێنی ســـەر و چـــاوی حەمـــەلاوی بـــە زمـــان ئەلـــستەوە ... لـــە پـــڕدا زۆر بـــە تونـــدی چەشـــنی كارەبـــا خەنجەرەكـــەی لـــە كـــالان دڕكێـــشا و بـــە زەربـــە یـــەكی تونـــد لـــە ســـەر دڵـــی خۆیـــدا و هـــاواری كـــرد حەمـــەلاو ... حەمـــەلاو ئـــەوەمنیش بـــە شـــوین تـــۆدا هـــاتم ... لـــە دڵـــی لـــەت كـــراوی جۆگەلەیـــەك خـــوین بـــە تونـــدی لـــە پـــاڵ دمـــی خەنجیرەكـــە پریـــشكەی دەكـــرد و ئەهاتە خووار.

دڵـــۆپی خوینەكـــە ئەكەوتـــە ســـەر لەشـــی بـــێ گیـــانی حەمـــەلاو وە تێكـــەڵ خـــوینی ئـــەو ئـــەبو ئەهاتـــە خـــوار زۆری نەكێـــشا چاوەكـــانی زەرد بـــون و بەدمـــەوە كەوتـــە ســـەر تەرمەكـــەی حەمـــەلاو ... خەڵكەكـــە خـــەجڵابون چاوەكانیـــان زەق ببـــووە. دەســـتیان تیكـــەڵ ئـــەهات و نـــەیان ئـــەزانی چـــە بكـــەن ... كـــاتی وە هـــۆش هاتنـــەوە كـــار لـــە كـــار ترازابـــو. ســـوارەی ڕەشـــید و لاوی چـــالاك و جـــووامیر روحـــی لـــە لەشـــی دەرچـــو بـــو، ئەڕویـــشت بـــەرو ئاســـمان ... قاســـم هـــاواری كـــرد : حەمـــەلاو ... ســـوارە ... بەســـەر خـــۆیی دا ئـــەدا بـــەڵام خەڵكەكـــە هـــەمویان گـــەمارویان دا و باوەشـــیان پـــێ داگـــرت و خەنجـــەر و تفەنگەكـــەیان بـــە زۆر لـــە دەســـت هەســـتاند، مـــام ڕەحمـــان هـــاواری كـــرد: « قاســـم بـــۆ

خاتری خووا تۆ نەیکەی، خۆت ئازارمەدە تۆ ئەبێت شوینەواری ئەم دو لاوە کویرنکەیتەوە. تۆ ئەبێ لە جیاتی ئەوان چرای سەر بەستی و ئازادی و ژیانی بەختەوەری بە دەستەوە بگریت و ئیمەش و تەواوی منالەکانمان لە تۆ دەرسی سەربەرزی و یەکەتیو برایەتی وەرگرین. ئەبیت تۆ یارمەتی ئیمە بدەیی کە لەداهاتو دا چۆن بەژین، قاسم ئەگەر تۆش لە دەست بەچی کی هەیە چاوی منالەکانمان بکاتەوە و خویندن و خویندەواریان فیر بکات و ئیمەش لە نەزانین و بەدبەختی و چەلەمەی ژیان رزگار بکات» خەلکەکە بە دەنگی بەرز هاواریان دەکرد نەکەی قاسم تۆمان ماوی تۆ خۆت راگرە فرمیسکی گەرم بە چاوەکانیان دا ئەهاتە خوار، قاسم ئەوندە گریابو کە هەناسەی لیبرابو. کاک عوسمان پیالەیەکی ئاو بە گەروی قاسم دا کرد و سەر و چاوی قاسمی شورت، قاسم کاتی نەفەسی هاتەوە بەر خۆی، روی کردە خەلکەکە و وتی : « من لە پاش ئەم قارەمانە رەشید و ئازایە چۆن بژیم. جەرگم تەواوی سوتاوە وەک رۆژی رەش هەلگراوە، تکاتان لێدەکەم بەرم دەن تاکو منیش خۆم بکوژم بە یکەوە شین مان بۆ بەگیرن» مام خالند هاواری کرد : « قاسم بۆ خاتری خووا بەسە جرگمان هەموی لەت لەتە با چی کە خویناو نەریژین، قاسم بیکە بەخاتری ئەم ریشە سپێ بەخاتری جەرگی براوم بۆ ئەحمەدی

جووانــە مــەرگ بــە خــووا ئەگــەر ئــارام نــەگریت منــیش خــۆم ئــەکوژم» ئــەمجار تــەواوی تفــەنگ بــە دەســـتەکانی هاوڕیــان کــرد ئیمــەش تــەواومان خۆمــان ئــەکوژین. قاســم دەســـتەکانی ســـارد بــووه ... هەناســەیەکی ســـاردی هــەڵ کێــشاو وتــی : « خۆشــک و بــرا بەڕیزەکانم پڕ بە دل سوپاس لە گەشت لایە کان ئەکەم من ئێستا بۆم دەرکەوت حەمەلاو ئەیی گوت بەک بگرن یەکەتی و یەک گرتن مانای چییە، من بەڵین و پێ ئەدەم لە خەزمەت ئێوه دا بم، سویند بە گۆڕی ئەم سی لاوه شەهیده، ئەوەی لە هێز و تووانیم دا هەیە لە هیچ بابەتێکەوه دریخی تان لەگەڵ ناکەم » مام ڕەحمان هاواری کرد و وتی:«تەرمی پاکی ئەم دو لاوه شەهیده ئەم دو لاوه ئازا و قارەمانە کەتامی ئازادی و سەربەستیان بە ئیمەدا بیان خەینە سەر شان و بەرو مزگەوت بکەوینە ڕی ... » کاک ڕەئوف هاتە جوواب و وتی : « ئەی تەرمی ئەم زۆردار و ملهۆڕانە چی » مام ڕەحمان وتی : « لە دەرەوەی ئاوایە کە قوڵکەیەکی گەوره هەڵ ئەکەنین و ئەم تاقمە نامرۆڤ و نامردانە بە تێکڕایی ئەخینە ناوی و سەری دا ئەپۆشین ... » لە پاش شوتن و کەفن کردنی حەمەلاو و سوارە یان خستە ناو تابوت و بەشین و گریان بەردیانن بۆ ژێرداره مازو پیرەکە و گۆڕیان بۆ هەڵ کەندن و بە ئاخی سارد و فرمیسکی گەرم تەرمەکانیان بە گۆری سارد

ئەسپارد لە بەر ئەمە تەواوی خەڵکی ئاوایی کێوە سور و گوندەکانی دەوروبەر کۆببونەوە تەواوی سەر کێوەکە و دامینی کێوەکەیان داگرتبو، جێگا نەمابو، قاسم ڕویشتە سەر بەرزایەکی بەڵیند و ڕاوەستا و لە تەواویان گەلیک سوپاسی کرد و ئەمجار باسی یەکەتی و یەک گرتویی و چالاکی حەمەلاو و سوارەی بۆ کردن کە بۆ لەناو بردنی ئەم تاقمە زۆردار و باج گر و مل هۆڕانە چە شەوان و ڕۆژان دانیشتبون و گلاڵەیان کێشابو، باسی نەبونی و کەساسی و نەخواردن و لیقوماوی لە ماوەی ئەم دو ساڵ خویندنەی بۆ کردن، باسی ئاوات و ئارەزوی ناو دڵی سوارە و حەمەلاوی بۆ کردن و ....

لە پاش ماوەیەک زۆر وتوویژ و شین و گریان و فاتیحا خوانی ئەمجار قاسم لەگەڵ خەڵکەکە بەر و مزگەوتی ئاوایی کێوەسور کەوتنە ڕی .... سەرە خۆشیکەیان ماوەی حەتویەکی خایاند، لە تەواوی ئاوایەکان بۆ سەرەخۆشی و سوپاس لەم پاڵەوانانە کە زوڵم و زۆری ئە» تاقمە ناپیاوانەی لەسەر تەواوی ئاوایەکان لا برد، لە پاش فاتیحەخوانی بە تیکڕایی ئەچونە سەر گۆڕی حەمەلاو و سوارە و ئەحمەد بۆ ڕۆحی پاکی ئەم سی لاوە دوعایان ئەکرد ....

